# ناوەڕۆک

## پێشەکی:

**الحمدلله له ما في السموات والأرض. الحمدلله فاطر السموات والارض. الحمد لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدى لولا أن هدانا الله. وهو الله لا إلٰه إلا هو الواحد القهار وله الحمد في الأولى وفي الآخره وله الحكم وإليه ترجعون.**

بەپێویستم زانی کەوا کورتەیەک لەسەر زانستێکی فەرامۆشکراو و گرنگ و پڕ بایەخ بکەم ئەویش زانستی نیشانەکانی قیامەت، لەژێر ناوی (مدخل علوم أشراط الساعة) واتە دەرگایەک بۆ چوونە نێو زانستی نیشانەکانی قیامەت، چونکە پووختەیەکی کورت باسدەکەم لە دەریایەک تەنیا بۆ چاوکرانەوە و ئاشنابوون بەوەی چی زانستێکە و چۆنە ئەم وەک ئەم فەرموودەیەی (صحيحين): عن حذيفة هو: كان الناس يسألون رسول الله ﷺ عن الخير وكنت أسأله عن الشر مخافة أن يدركني.

هاوەڵی بەڕێز "حذيفه بن اليمان" رضى الله عنه، دەڵێت خەڵکی پرسیاری خێریان لە رسول الله ﷺ دەکرد من بە پێچەوانەوە پرسیاری شەڕ و فیتنەم لێ دەکرد لەترسی ئەوەی توشم نەبێت و تێی نەکەوم. بۆیە دیقەت

بدەن هاوەڵان چەند وریابوون پرسیاری ڕێگای ڕزگار بوون لە فیتنەیان کردووە لەپێناو پاراستنی ئیمانیان. کەچی ئەمڕۆ خەڵک نەک پرسیار ناکات، بەڵکو دژایەتی ئەوانەش دەکەن کە خەڵک لەفیتنەکانی کۆتا زەمان ئاگاداردەکەنەوە، دەڵێن کەی کاتی ئەوەیە. باشە بۆچی رسول الله بە "حذیفە"ی نە ووت کەی کاتی ئەم باسانەیە ئێمە تازە لەسەرەتای ئیسلامین؟!

(إمان بالیوم الآخر) ڕوکنی ئیمانە کە پێی دەڵێن (یوم القیامە). (یوم القیامە) هەر لەسەرەتایی خەلقی "ئادەم" علیە سلام هۆشیارکراونەتەوە کە پێی دەڵێن نیشانە و پێشهاتەکانی قیامەت. بۆنمونە ئەم فەرموودانە کە لە صحیح "بخاری" و "مسلم" داهاتوون: عن أنس رضي الله عنه قال: قال النبي ﷺ: (**ما بعث نبي إلا وأنذر أمته الأعور الكذاب ألا إنه أعور وإن ربكم ليس بأعور وإن بين عينيه مكتوب كافر**).

واتە هیچ پێغەمبەرێک نییە هاتبێت، ئەوا خەڵکەکەی لە کوێری درۆزن ئاگاداركردووەتەوە، مەبەستی دەجالە.

له فەرموودەیەک دەڵێت له "نوح" علیه سلام تا (خاتم الأنبیاء). وەک مەعلومه "دەجال" له پێشهاتەکانی قیامەته و یەکێکه له نیشانه گەورەکانی پێش قیامەت. کەواته گەر "نوح" علیه سلام خەڵکەکەی له دەجال ترساندبێت ئەوا ئێمه ئەولاترین تا باسی بکەین، چونکه ئێمه له ساتی دەرچوونی داین. لەناو هاوەڵانیش الله لێیان ڕازی بێت هاوەڵی واهەبووه زۆر گرنگی بەم باسانه داوه وەک "حذیفه"، بۆیه ناویان لێناوه (صاحب السر رسول). وەک له مەجلیسێکدا "عمر بن الختاب" الله لێی ڕازی بێت دەڵێت: حَدَّثَنَا شَقِيقٌ، سَمِعْتُ حُذَيْفَةَ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ عُمَرَ إِذْ قَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْفِتْنَةِ؟ قَالَ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصَّدَقَةُ وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ. قَالَ: لَيْسَ عَنْ هَذَا أَسْأَلُكَ، وَلَكِنِ الَّتِي تَمُوجُ كَمَوْجِ الْبَحْرِ. فَقَالَ: لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْهَا بَأْسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا. قَالَ عُمَرُ: أَيُكْسَرُ الْبَابُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: لَا، بَلْ يُكْسَرُ. قَالَ عُمَرُ: إِذًا لَا يُغْلَقَ أَبَدًا؟ قُلْتُ: أَجَلْ.

قُلْنَا لِحُذَيْفَةَ: أَكَانَ عُمَرُيَعْلَمُ الْبَابَ؟ قَالَ: نَعَمْ، كَمَا يَعْلَمُ أَنَّ دُونَ غَدٍ لَيْلَةً، وَذَلِكَ أَنِّي حَدَّثْتُهُ حَدِيثًا لَيْسَ بِالْأَغَالِيطِ، فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَهُ مَنِ.

واتە "حذیفە" دەڵێت لای "عمر" الله لێی ڕازیبێت دانیشتبووین، فەرمووی: کێتان قسەی رسول الله ﷺ ی لەبەرە لەسەر فیتنە. گوتی: فیتنەی پیاو لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانی و جیرانەکانی ئەوا نوێژ و خێر و ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر دەیان سڕێتەوە من ئەوە ناڵێم، بەڵکو ئەو فیتنەی کە وەک مەوج و شەپۆلی دەریا. ووتم: ئەوە زۆر کێشە نییە لەبەر تۆ ئەی ئەمیری ئیمانداران. لەنێوان تۆ و ئەودا دەرگایەکی داخراو هەیە. گوتی: ئایا دەشکێت یان نا ووتم بەڵکو دەشکێت. گوتی: کەواتە هەرگیز داناخرێت. صحیح بوخاری ئەوەی من مەبەستمە تیشک بخەنە سەر ئەوەی (فاروق الأم) چۆن پرسیاری شەڕ و فیتنە دەکات تا خۆی لێدەرباز بکات و تیشک بخەنە سەر ئەوەش لەنێوان هەموو ئامادەبوان، تەنیا یەکێک زانی لە بارەی فیتنەکان و ئەویش "حذیفە" بوو.

لەم ڕۆژگارەش دەبێت خۆتان بچن پرسیار بکەن لە ئەهلی عیلم و شارەزایانی (فتن وملاحم)، چونکە ئێستا لەنێوان گێژاوی فیتنە گەورەکان

داین لەسەرو بەندی ئەم فیتنانەداین کە دەڵێت پیاو ڕۆژ دەکاتەوە ئێماندارە شەوەکەی کافرە، سبحان الله چەندە گەورەن و چەند وورد و شاراوەن. بۆیە لە ماوەیەکی چەند سەعاتێک ئیماندار کافر دەبێتەوە. ئێمەش خۆمان ڕۆژانە پێنج جار لە نوێژە فەرزەکان دوای تەحیات داوای پەناگری لە الله دەکەین لە فیتنەکان دەڵێین: (اللهم إنى أعوذ بك من فتنة محيا ومماة وفتنة مسيح الدجال).

هۆکاری داواکردنەکەش تاوەکو ئیمانمان پارێزراوبێت و توشی کوفر و شیرک نەبین، ون نەبین لە زەمەنی وونبووندا. الله ڕێمان ڕۆشن بکات لە کاتی هاتنی فیتنەکان بۆ سەر دڵان پەیتا پەیتا.

**✍ لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی**

**٦ ذوالحجة ١٤٤٠ ی کۆچی**

**بەرامبەر ٢٠١٩/٨/٧ ی زاینی**



# جیاوازی چییە لەنێوان بانگەوازی غەیب و قسەکردن لە پێشهاتە غەیبییەکاندا لە ڕوانگەی قورئان و فەرموودەوە؟

## بەشی یەکەم: لە ڕوانگەی قورئانەوە.

دوای ئەوەی هەستم پێکرد زۆرینەی ئـــەوانەی موتابعەی نیشانەکان دەکەن لەم بـاسەدا لاوازن و خەڵکیش بەگشتی زۆر لاوازە لەم باسە کە بەهەند وەرنەگیراوە. ساڵی پار دوو بەشم باسکرد کۆتاییم پێ هێنا، بەڵام بەشێکی زۆر لەم باسەدا نازانن ناوەڕۆکی چییە و چۆنە. بۆیە دەمەوێت بەشێوەیەکی وورد و پووخت قسەی لەسەر بکەم و هەندێک شت بە بەڵگەی موقنع و مەلمووس و قەطعی ببڕێنمەوە و ڕوونی بکەمەوە بإذن الله تعالی.

لەم بەشەدا خاڵێکی زۆر گرنگ باسدەکەم، ئەویش بریتییە لە جیاوازی لە قسـەکردن لە باسی غەیب و بانگەوازی غەیب، واتە ئایا جیاوازن یان نا؟

پشتیوان بە اللە بۆتان ڕووندەکەمەوە ئەم دوو دەستەواژە چی جیاوازییەکیان هەیە. ئنجا لە واقیع و شەرعیشدا زۆر جیاوازن، بەڵام خەڵکی وا دەزانێت هەردووکی هەریەکە، چۆن؟

لەوەڵامدا دەڵێم دەبینم لە باسی نیشانە و پێشهاتەکان، کاتێک قسەدەکەم بەوە تۆمەتبار دەکرێین کەوا ئێمە ئیدیعایەی یان بانگەوازی غەیب دەکەین. بابزانین ڕاستە؟

لە شەرعدا واتــە لەم دینەدا کە ئیسلامە و کۆتا ئوممەتە و ئوممەتی ئاخیر زەمانە. گرنگییەکی زۆر وورد دراوە بە باسی قیامەت و نیشانەکان هەم لە قورئان و هەمیش لە فەرمووددەدا و قەولی هاوەڵان کە باسی هەموویان دەکەم. هەروەها ڕێگە نەگیراوە هەرگیز لەوانەی پرسیاری قیامەت دەکەن، چۆن؟

**یەکەم: (علم الغیب) باسی قیامەت:**

لێرەدا جیاوازیتان لە قورئان بۆ دەردەهێنم. جیاوازی قیامەت و نیشانەکان کە قیامەت غەیبە و یەکێکە لە (مفاتح الغیب)، بەڵام نیشانەکان ڕێگە دراوە بە باسکردن و قسەکردن لێیان. بۆنمونە لە قورئاندا کاتێک

پرسیاری قیامەت لە پێغەمبەر ﷺ کراوە، الله چۆن وەڵامیانی داوەتەوە.

قال الله تعالى: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ۚ ﴾[١]

وەک دەبینن لەم ئایەتەدا هاتوون پرسیاریان کردووە دەربارەی کاتی قیامەت. وەک ووتم لەبەرئەوەی (مفاتیح الغیبه)، بۆیە دەبینین الله تعالى لە وەڵامیان پێی ووتوە پێیان بڵێ زانست و زانیاری و کاتی هاتنی تەنها الله دەیزانێت، کەواتە لێرەدا ڕاستەوخۆ سنووری بۆ دانان. هەروەها لەم ئایەتەشدا ڕوونترکراوەتەوە. وقال الرحمن في كتاب الكريم: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾[٢]

وردبنەوە لێرەدا الله تعالى باسەکە فراوان دەکات بەوەی هیچ کەسێک لە هەرچی ئاسمان و زەوییە نازانێت لە غەیب و ناشزانێت چی کات و

١ سوره الأعراف: ١٨٧

٢ سوره النمل: ٦٥

ساتێک قیامەت و زیندووبونەوە بەرپا دەبێت. لێرەدا تیشک بخەنە سەر کاتی زیندووبونەوە، واتە (یوم البعث). کەواتە قیامەتی گەورەیە و یەکێکە لەناوەکانی قیامەت، بۆیە جیاوازی بکەن لەم باسەدا هەروەک چۆن لە قورئان بۆمان باسکراوە. (مفاتيح الغيب) یان کلیلەکانی غەیب پێنجن کە لە قورئان و لە فەرموودەی (صحیح) باسکراوە. وقال الله تعالى: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[1]

**یەکەمیان:** (علم ساعه) واتە هاتنی قیامەتە.

**دووەمیان:** داباریني باران.

**سێیەمیان:** چی شتێک لە ناو ڕەحمی دایکدا دەبێت.

**چوارەمیان:** هیچ کەسێک نازانێت بەیانی چی بەسەردێت.

**پێنجەمیان:** هیچ کەسێک نازانێت لە چی زەوییەک دەمرێت.

---

١ سوره لقمان: ٣٤

ئەمانە (علم غیب)ن، با لاتان ڕوون بێت، واتە تەنانەت ئەم هیچ ملائیکەتێکی نزیکیش نایزانێت إلا الله.

**دووەم: باسی نیشانەکانی قیامەت:**

ئەمەیان تایبەتە بە نیشانەکانی قیامەت کەوا پێی دەڵێن قسەکردن لە غەیب، چۆن؟

وقال الله تعالى: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ﴾[١]

لێرەدا الله تعالى باسی نیشانەکانی قیامەت دەکات لە یەکەمدا دەفەرمووێت: (أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً) واتە لەناکاو دێت، بۆچی؟

چونکە قیامەتی گەورەیە و (مفاتیح الغیب)یشە. بەڵام دواتر دەفەرمووێت هەندێک نیشانەکانی دەرکەوتوون. وەک، قال الله في كتاب الحكيم: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾[٢]

---

١ سوره محمد: ١٨

٢ سوره القمر: ١

ئێستا دیقەت بدەنە ئەم وشە لێرەدا جیاوازییەکە ڕووندەبێتەوە، دەفەرمووێت قیامەت نزیکبووەوە و مانگیش کەرت بوو دەبینین نەیفەرمووە غەیبە بەڵکو خودی خۆی پێمان دەفەرمووێت نزیکبووەوە.

لە ئایەتێکی تردا، قال الله تعالى: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ﴾[1]

نزیکبوونەوەی دیاریکراوە، واتە لە باسی نیشانەکان یان قسە لە غەیب هەمیشە بەنزیک سەیرکراوە. بۆنمونە نیشانەکان تەنانەت لە قورئانیش باسکراوە. وقال الله تعالى: ﴿حَتَّىٰ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾[2]

وەک دەزانین (يأجوج ومأجوج) یەکێکن لە نیشانە گەورەکانی پێش قیامەت و لیرەش بۆمان دیاریکراوە. هەروەها لە سورەتی (النمل)یشدا

---

١ سوره الأنبياء: ١

٢ سوره الأنبياء: ٩٦

وەک، قال الله تعالى: ﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾[1]

دەبینین لێرەش باس لەنیشانەی پێش هاتنی قیامەت کراوە، وەک (دابە الأرض) یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی پێش قیامەت. ئایەتی تر هەن، بەڵام ئەوانە تەواون بۆ تێگەیشتن. ئێستا دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوە وەردەگرین بەکورتی. ئەمە تەنها تایبەت بوو بە قورئان.

لە خاڵی یەکەم لەبەرئەوەی باسی هاتنی کاتی قیامەت بوون و (مفاتیح الغیب)یش بوو. بۆیە سنور دانراوە، واتە لێرەدا هەریەکێک ئەم شتانەی ووت ئەوا ئیدیعایەی غەیبە. واتە بانگەوازی غەیب بەمەش کافر و بێ ئیمان دەبێت گەر تۆبە نەکات وەیل جێگایەتی پەنا بە الله.

لەخاڵی دووەم ووردبنەوە باسی نیشانەکانی پێش قیامەت دەکرا و تەنانەت چەندەها نیشانەمان بۆدیاریکراوە پێی (قسەکردن لە غەیب) (نەوەک بانگەوازی غەیب).

١ سورة النمل: ٨٢

دواتر لەفەرموودەکان ووردتر و باشتر بۆتان ڕووندەبێتەوە، بۆیە ناکرێت کە شتێک عیلمت پێی نەبێت، خەڵکی تری پێ گوناهبار بکەیت. ئەمە جیـاوازی و ناسینی ئەوەبوو کە قسەکردن لە غەیب چییە و چی دەگرێتەوە و بانگەوازی غەیبیش چییە و چی شتێک دەگرێتەوە بەپێی بەڵگەی قورئان.

## بەشی دووەم: لە ڕوانگەی فەرموودەوە.

لەم بەشەدا تیشک دەخەمە سەر زانستی نیشانەکان، لە فەرموودەکاندا چۆنە و چۆن مامەڵەی لەگەڵ کراوە لە چی ئاستێک شتەکان ڕوونکراونەوە و لە چی ئاستێک غەیبە؟ واتە بۆمان ڕوونبێتەوە چی شتێک بانگەوازی غەیبە؟

**وەڵام:**

### فەرموودەی یەکەم: لە صحيح مسلم كتاب (الإمان):

ئەم فەرموودە کەمێک دوور و درێژە بۆیـە من تەنیا ئەم بەشەی تایبەتە بە باسەکانمان دایدەنێم و قسەی لەسەر دەکەین پشتیوان بە خوای گەورە.

لێرەدا ئەم کەسەی پرسیار دەکات "جبريله" عليه سلام دەفەرمووێت:

قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: (مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّهَا فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا كَانَتِ الْعُرَاةُ الْحُفَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رِعَاءُ الْبَهْمِ فِي الْبُنْيَانِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ). ثُمَّ تَلَا (ﷺ): {**إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**}.

ئنجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەی ڕۆژی قیامەتە؟ فەرمووی: پرسیار لێکراو لەوبارەیەوە کە (هاتنی قیامەتە) زاناتر نییە لە پرسیارکەر. بەڵام باسی نیشانەکانیت بۆ دەکەم: هەرکاتێک کەنیزەک گەورەکەی خۆی بوو، ئەوە لەنیشانەکانیەتی. هەروەها ئەگەر ڕووت و پێخاوسەکان ببنە کاربەدەستانی خەڵک، ئەوەش لەنیشانەکانیەتی. هەروەها هەرکاتێک شوانی مەڕوماڵاتەکان شانازییان کرد بەبەرزی کۆشکەکانیانەوە دوای

ئەوەی دەست دەگرن بەسەر کاروبارياندا ئەوەش لەنيشانەکانيەتی. پێنج شتيش هەن کەس نايانزانێت جگە لەخوا، ئنجا ئەم ئايەتەی خوێندەوە:

﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[١]

## شيکاری فەرموودەکە چۆنە؟

لێرەدا جبريل عليه سلام ڕاستەوخۆ پرسياری لە (مفاتيح الغيب) کە (يوم الحسابە) لێ دەکات؟ بۆيە وەڵامی بۆی دەفەرمووێت تۆش نايزانيت، بۆ؟ چونکە غەيبە. وەک ووتمان لە (مفاتيح الغيب) و مفاتيح الغيبيش. قال الله تعالى: ﴿قُلْ لَايَعْلَمُ مَنْ فِى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ الْغَيبَ إِلَّا اللَّهُ﴾[٢]

---

١ سورة لقمان: ٣٤

٢ سورة النمل:٦٥

بۆیە قسەکردن لێی کوفرە، بەڵام پێی دەفەرمووێت هەواڵت پێ دەدەم لەبارەی نیشانەکانی پێش هاتنی. بۆیە دیقەت بدەن. (نیشانەکان) و ئەم نیشانانەی کە باسی کردووە هەمووی دەرکەوتوون.

بۆیە دەبێت ئێوەش جیاوازی بکەن، کاتێک ئێمە دەڵێین گەر بۆنمونە زەوی عەرەب سەوز بێت و ببێتە کانیاو و ببێیتە شەڕی نێوان سێ کوڕە خەلیفەکە، ئەوا ئنجا مەهدی دەردەچێت.

ناکرێت بڵێین ئەمە ئیدعایەی غەیبە بەڵکو قسەکردنە لە مەسائیلی غەیبی و نیشانەکانی پێش قیـامەت، ئەویش بەپێی ئەم مەرجانەی کە دانراون. واتە مەرجە ئەم کەسەی باسی نیشانەکان دەکات یان ڕووداوێک بیەوێت ببەستێتەوە بە فەرموودە و باسی قیامەت دەبێت بەبەڵگەی دانراو و ملمووس و سیقە قسە بکاتن چونکە زۆر هەستیارە لەبەر غەیبیات.

**فەرموودەی دووەم: صحيح بخاری کتاب (العلم) مسند إمام أحمد.**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: (بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ

حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ، قَالَ : أَيْنَ أُرَاهُ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَإِذَا ضُيِّعَتِ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ. قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ).

**پووختەی فەرموودەکە:** (ئەعرابی) واتە دەشتەکی هاتە لای رسول الله ﷺ پێی ووت کەی قیامەت دێت؟

لەسەرەتا وەڵامی نەدایەوە، بۆیە هەندێک ووتیان گوێی لێ بووە، بەڵام حەزی لێنەبووە وەڵام بداتەوە و هەندێک ووتیان بەڵکو گوێی لێنەبووە. بۆیە کە تەواو بوو پرسی کێ بوو هات پرسیاری لەسەر قیامەت کرد؟ وتی من بوم، پێی فەرموو: کاتێک ئەمانەت نەما و لەناوچوو چاوەڕێی قیامەت بە. ووتی چۆن نامێنێت؟ فەرمووی: گەر ئەم ئەمرە، واتە حوکمی ئیسلام و موسڵمان بکەوێتە دەست کەسی نەشەیستەوە.

**شیکاری فەرموودە:**

لەم فەرموودەیەدا کەسێک پرسیار لەشتێکی غەیبی دەکات کە قیامەتە. بۆیە دەبینین وەڵامی رسول الله ﷺ، قسەی لەمەسائیلی غەیب بۆ کرد نەک غەیب، چۆن؟

گەر پێی فەرمووبا بیست ساڵی تر یان دوای ئەم شتە ڕاستەوخۆ قیامەتە، ئەوە ئەبووە (ادعایة غیب). بەڵام ئەو زۆر بەووردی وەڵامی دایەوە، بەڵکو نیشانەیەکی پێ فەرموو کە (نەمانی ئەمانەتە) گەر نەما چاوەڕێی قیامەت بە!

سەیر بکەن ووردبنەوە لەم وشە (فانتظری الساعة)، واتە چاوەڕێی قیامەت بکە، بۆ؟ چونکە غەیبە هاتنی (یوم القیامە). کەواتە سنوری بۆ دانا بەهۆی ئەم وشەوە .

**لەکۆتایی ئەم شیکارییەدا:**

دەبێت هەم ئەو کەسانەی کە باسی نیشـانەکان دەکەن، واتە باسی قیامەت دەبێت زۆر بە تەرکیز و ووردبن و هەستیاربن لەدەربڕینی وشەکان، چونکە غەیبە. بۆیە ئێمە کاتێک قسە لەسەر مەسائیلە غەیبییەکان دەکەین، مەرجمان بۆ دانراوە و ئێمە کاتێک قسە لەسەر مەسائیلە غەیبییەکان دەکەین مەرجمان بۆ دانراوە و حدودێک کە نابێت بیبەزێنین، گەرنا دەبێت بە ژیانمان بـــاجەکەی بدەین پەنا بە اللە.

هەروەها خوێنەریش دەبێت ووردبێت. نابێت و ناشکرێت کاتێک قسە لەسەر نیشانەکان و ڕووداوەکان دەکەین ناکرێت تۆمەتبار بکرێین بەوەی کە ئێمە ئیدعایە یان بانگەوازی غەیب دەکەین. کەواتە جیاوازی بانگەوازی غەیب و قسەکردن لێی ڕوونە.

## بەشی سێیەم: گرنگی ئەم زانستە لای زانایانی فەرموودە.

لەم بەشەدا پشتیوان بە الله چەند زانیارییەکی کورتی ژمارەیی دەخەمەڕوو سەبارەت بە زانستی نیشانەکان کەوا خۆی دەبینێتەوە لە (الفتن والملاحم).

### ١- كتاب (الفتن) لـ"نعيم بن حماد المروزي":

ئەم کتێبە خۆی دەبینێتەوە لە زیاتر لە دوو هەزار فەرموودە لەسەر نیشانەکان. هەم لە (فتن) و لە (ملاحم)، واتە جەنگەکاندا و یەکەم ئیمامە بەم شێوەیە باس لە (الفتن) بکات و فەرموودەکان پێکدێت لە (صحیح) و (حسن) و (موضوع) و (ضعیف) و (ضعیف جدا).

### ٢- مصنف "إبن أبي شيبة" (كتاب الفتن):

ئەم پێشەوایەی زانستی فەرمووده کە لە مصنەفەکەیدا نزیکەی چل هەزار فەرموودەیە و کتێبێکی تایبەتکردووە بەم باسە کە زیاتر لە چوارسەد فەرموودەی تێدایە زۆرینەیان تایبەتن بە نیشانە و (فتن) و (ملاحم)ەکان.

**٣- صحيح "بخاری" كتاب (الفتن):**

أمير المؤمنين في الحديث، لە کتێبە هەرە بەناوبانگ و نازدارەکەی کتێبێکی تایبەتکردووە بە (الفتن) کە خۆی دەبینێتەوە لە نزیکەی سەد فەرموودە تێیدا باس لە نیشانەکان و (فتن) و (الملاحم) دەکاتن.

**٤- صحيح "المسلم" كتاب (الفتن والملاحم):**

پێشەوای ئوممەت "مسلم بن حجاج" لە صەحیحەکەیدا کتێبێکی تایبەتکردووە بەم باسە، واتە نیشانەکان. هەم (فتن) و لە جەنگ و (ملاحم)ەکان کە زیاتر لە دووسەد فەرموودەی تەواو و دروستی تێدایە لەم بارەوە.

**٥- إمام "أبو داود" كتاب (الفتن) و كتاب (الملاحم) و كتاب (المهدی):**

ئیمام "أبو داود" یەکێکە لە پێشەوایانی گەورەی ئوومەت لەدوای "بخاری" و "مسلم" و سننەکەیدا سێ کتێبی تایبەت کردووە بە زانستی نیشانەکان.

**یەکەم:** کتاب (الفتن).

**دووەم:** کتاب (المهدی).

**سێیەم:** کتاب (الملاحم).

کەوا زیاتر لە دووسەد فەرموودەی لەخۆگرتووە زۆرینەیان (صحیح)ن.

**٦- سنن "ابن ماجه" کتاب (الفتن):**

ئیمام "ابن ماجه" یەکێک لە گەورە موحەدیثانی ئوممەت کتێبێکی تایبەتی لە سوننەکەی داناوە. لە (الفتن) نزیکەی سەدو پەنجا فەرموودەی هێناوە زۆرینە (صحیح)ن.

**٧- إمام "أحمد بن حنبل" (مسند أحمد):**

لەبەرئەوەی ئەوەی ئیمام "أحمد" (مسند)ە و سیفەتی (مسند)یش وەک "بخاری" و (سنن)ەکان و (مصنف) نییە. واتە کتێب بێت بەڵکو بەم شێوەیە

(مسند مدنیین) یان (شامیین) یان (مسند أبوهڕیره) یان (انس بن مالک) ڕەزاو ڕەحمەتی اللەیان لێ بێت. بەڵام لەم (مسند)ە کە نزیکەی سی هەزار فەرموودە زیاتر یان کەمتر نازانم تێدایە، بەڵام سەدان فەرموودەی تێیدا باسکراوە هەم لە مەهدی و دەججال و نیشانە و (ملاحم)ەکان.

## ٨- المستدرک علی صحیحین إمام "حاکم":

ئیمام "حاکم" لە (مستدرك)دا و لە (المستدرك على صحيحين) نەک (المستدرك)، واتە زۆرینەی فەرموودەکان گومان لە ڕاستی و دروستیان نییە، کە کتێبێکی تایبەتکردووە بەناوی کتێبی (الفتن) نزیکەی سێ سەد فەرموودەی لەم بارەوە باسکردووە زۆرینەیان ڕاست و دروستن. ئەم زانیاریە بۆئەوەیە تاوەکو بزانرێت سەدان و هەزاران فەرموودە لەسەر نیشانە و (فتن) و (ملاحمەکان) هاتوون و گرنگیەکی زۆریشی هەیە. بۆیە ئەوانەی کەوا کاتێک قسە لەسەر نیشانەیەک یان ڕووداوێک دەکەن، ڕاستەوخۆ تۆمەتی ئەوەت دەدرێتە پاڵ ئەمە غەیبە یان بوویتە تاغووت یان قسەکانت وەکو ئەوەیە (عالم الغیب)بیت کەوا پەنا بە الله دەگرم لێیان. نەخێر بەڵکو تۆ پێویستە خوت فێرە ئەم عیلمە بکەیت، چونکە نازانیت و

کەنەشتزانی لەکاتی فیتنەدا تیادەچیت، چونکە کاتێک شتێکت بۆ باسدەکرێت دەڵێین بەپێی فەرموود لەوانەیە ئەم شتە ڕوویدات و لەبەرئەوەی عیلمت پێی نییە بۆیە وون دەبیت.

## بەشی چوارەم: هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی ئەم زانستە لە کۆن و ئێستادا.

یەکێکە لە زانستە وورد و ئاڵۆز و (متغیر) گۆڕاوەکان و غەیبیاتەکان و زۆر هەستیارە. لەئێستادا عیلمێکی زۆر فەرامۆشکراوە لای زۆرینەی خەڵک و چینی ئیماندارانیش. ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە کە زۆرینە لەم عیلمە تێنەگەیشتون وەک خۆی هەروا دەزانن شتێکی ئاسایی و تەواو هیچی دی نییە! نەخێر، بإذن الله هەندێک شتتان بۆ ڕووندەکەمەوە بۆ زیاتر زانینی واقیع و ڕووداوەکان و تێگەیشتن لە نیشانەکان.

١- لەسەرەتادا دەمەوێت پێتان بڵێم ئەم عیلمە جووڵاوە، بەردەوام لەگۆڕاندایە، چۆن؟

بۆنمونە لەدەوروبەری سەد ساڵ پێش ئێستا کاتێک کە کتێبێک لەسەر نیشانەکان نوسرابێت، ئەگەر بێتو ئەم کات بیست نیشانە دەرکەوتوبووبێت ئێستا هەشتا دەرکەوتووە. ئەمەیە گۆڕانکاریەکە، واتە بۆنمونە نیشانەی (مروجا وأنهارا) یان نیشانەی (انتفاخ الأهله) یان نیشانەی (زلزال) یان نیشانەی (خسف) ئەم نیشانانە تازە ڕوویانداوە، پێشتر دەرنەکەوتبوون و نەهاتبوونەدی، بۆیە بەهاتنەدییان هەنگاوێک لە قیامەت نزیکتربووینەوە. کەواتە ئەگەر من ئێستا باسی نیشانە بچووک و دەرکەوتووەکان بکەم بۆتان لەهەموو یان جیاوازترە، بۆ؟ چونکە زۆر نیشانە ئێستا دەرکەوتوون ئەم کات دەرنەکەوتبوون.

٢- هەروەها زانستێکە پێکانی لە جیلێکەوە بۆ جیلێکی دی چاکتر دەپێکرێت. چۆن؟

لەبەرئەوەی لەم عیلمەدا باس لە گۆڕانی یان پێشهاتێک دەکرێت کە لە داهاتوو ڕووبداتن، کەواتە غەیبە واتە قسەکردن لە پێشهاتە غەیبییەکان بووە! بۆیە بەشێک لەزاناکانی ئەم بوارە زۆر بەوریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە، چۆن؟ لەبەرئەوەی عەقڵی مرۆڤ مەحدودە لە ئاستێک

ڕادەوەستێت و لەبابی غەیب زاناکان بەپێی ئەم سەردەمەی کەتێیدا بوون لێکدانەوەیان بۆ فەرموودەکانی (أشراط الساعة) کردووە، نەبادە تووشی والعیاذ بالله لەدین دەرچوون بێن.

نموونە لەسەر محمد مەهدی، کاتێک کە زاناکان هەڵساون بە لێکدانەوەی فەرموودەکانی باس لە بەیعەت لەنێوان ڕوکن و مەقام دەکاتن، ئەو کاتەی دەیانەوێت بیعەتی پێبدەن محمد مەهدی لە دەستیان ڕادەکات چەند جارێک دەچێتە مەدینە و دێتەوە مەککە لێرەدا زاناکان هەڵساون لێکدانەوەیان بۆ کردووە بەوەی کەوا الله کرامات دەدات بە مەهدی. چونکە وەک مەعلومە کەوا دووری نێوان مەککە و مەدینە زیاتر لە چوار سەد کیلۆ مەترە. بۆیە وایان لێکداوەتەوە، کەواتە ئەوان حوکمیان کردەووە لەسەر ئەم واقیعەی ئەم کات وجودی هەبوو. ئێوە بێننە پێش چاوتان سێ سەد ساڵ پێش ئێستا هیچ وەسائیلێکێ گواستنەوەی خێرا وەک ئێستا وجوودی نەبووە. کەواتە ئایا پێکاویانە؟

**وەڵام:** بەپێی ئەم واقیع و گۆڕانەی کە ئێستا وجوودی هەیە نەیان پێکاوە. ماوەیەک پێش ئێستا خێراترین هێڵی گواستنەوەی شەمەندەفەر لەنێوان مەککە و مەدینەدا کرایەوە، کەواتە لێکدانەوەی ئەم جیلە پێکاوترە.

٣- عیلمێکە پڕ نهێنی و مەترسیدارە، لەبەرئەوەی لەم دینەدا ئیسلام ئێمە لەلایەن اللەوە لەسەر زمانی رسولەکەی ﷺ ئاگاداکراوین لە زۆرترین ڕووداوەکان و بەتایبەت (فتن) و (ملاحم)ەکان. ئەمەیش بۆ خۆپاراستنمانە لێیان لە ئەبو هڕێرەوە ڕەزاو ڕەحمەتی اللەی لێبێت: (حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وِعَاءَيْنِ ، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَبَثَثْتُهُ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَلَوْ بَثَثْتُهُ قُطِعَ هَذَا الْبُلْعُومُ)[١].

واتە دەڵێت من لە پێغەمبەری اللەم ﷺ وەرگرتووە دووبەش، یەکێکیان ئەوەیە وتوومە، ئەوانیش خۆی لە نوێژ و ڕۆژ و ئەحکامەکانی دی دەبینێتەوە. یەکێکی دی ئەگەر باسی بکەم ئەوا قوڕگم دەبڕن یان سەرم دەبڕن.

---

١ رواه البخاري (رقم/١٢٠)

بۆچی وای گوت؟ ئایا ئەوەی کە دەڵێت باسی بکەم باسی کردووە یان نا. بێگومان ئەم قسەی لەسەردەمی فیتنەی (غلمانی) قورەیش دا بووە، باسم کردووە ناچمە ناو تەفاسیڵ. بەڵام ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە کەوا چۆن ئێمە خاڵ بەخاڵ و فیتنە بەفیتنە ئاگادارکراوین. لەفەرموودەیەکی دی دەڵێت: (اللهم لاتدركني سنة ستين).

واتە خوایە نەمگەیەنیتە ساڵی شەستەکان یان لە ڕیوایەتی دی دەڵێت: (أعوذ بالله من رأسی ستين وأمارة صبيان).

واتە پەنا دەگرم بە الله لە سەرەتای ساڵی شەستەکان و دەسەڵاتی منداڵ.

سبحان الله ئێوە سەیربکەن چۆن ساڵ تەحدید دەکات ساڵی شەستەکان! هەروەها ناوهێنانی ئەم کەسەی کە خەلافەت دەگرێتە دەست ئەمە دەکەمە پاڵ پشت بۆ کتێبی (فتن) حافظ "أبو عبد الله نعيم بن حماد مروزي". کەوا ناوی بەشێکی زۆر تەنانەت لەسەرکردەکانیشی هێناوە!

تەبعەن الله تعالى ئەم دوعایەی لێوەر دەگرێت ساڵێک بەر لە شەستەکان دەمرێت. بۆیە پێویستە ئێوە بزانن نیشانەکان، واتە عیلمێکە تاوەکو نەچیتە ناوی بەئاسانی لێی تێی ناگەیت. هەروەها ڕوکنی چوارەمی پایەکانی ئیمان (باوەڕە). بەڵام بەداخەوە دەبینم زۆربەی زۆری زۆر لەم عیلمە بێ ئاگان. تەنیا دەڵێن فلان وا، ئێستا سەردەمی فیتنەیە و لە هەموو کات زیاتر پێویستان بەم عیلمە هەیە.

## بەشی پێنجەم و کۆتایی: تایبەتمەندییەکانی ئەم زانستە.

لەم بەشەدا هەندێک بەڵگە دەخەینەڕوو کەوا زاناکان بەهۆی واقعی حاڵیان نەیانتوانیوە لێکدانەوەکان بپێکن، بۆیە زۆر قەول و فەرموودە هەیە بەهەند وەرنەگیراوە. زانستێکە بەپێی زەمەن زیاتر نهێنییەکانیان بۆدەردەکەوێت. ئەم خاڵە زۆر گرنگە واتە بەهۆی ئەوەی کەوا (وماینطق عن الهوى) لەلایەن اللهوە ئاگادارکراوە، گەرنا چۆن دەزانێت دوای زیاتر لە هەزار ساڵ ئەم شتانە ڕوودەدات. هەروەها زاناکانیش لەسەردەمێک بۆ

سەردەمێکی تر چاکتر لێی تێگەیشتوون. بۆنمونە، چەند فەرموودەیەک لە (فتن نعیم بن حماد):

١- وفي مصنف عبدالرزاق: ويل للعرب من شر قد اقترب، الأجنحة وما الأجنحة؟ الويل الطويل في الأجنحة، ريح فيها هبوبها، ما هي الأجنحة التي كهبوب الريح ؟!!

هاوار بۆ عەرەب لە شەڕ و فیتنەیەک کەوا نزیک بووەتەوە، باڵەکان باڵەکان چین؟ هاوارێکی زۆر لە باڵانەوەیە و با لێوەی دەرەچێت؟!

باشە گەربێت و ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سێ سەد ساڵ بەر لە ئێستا دەبێت چۆن بیربکەینەوە لە وشەی باڵەکان بێگومان هیچ بیرۆکەیەکمان بۆ نە دەهات. بەڵام ئێستا دەزانین ئەم باڵانە مەبەستی فڕۆکەیە و فڕۆکەی جەنگی. ئەمەش دوای ئەوەی ئێمە لەم سەردەمە شتەکانمان لەپێش چاوە. کەواتە دڵنیابن تێگەیشتنی ئێستا واقعیانەتر و پێکاوترە وەک لە ئی پێشوو.

٢- وروى نعيم بن حماد المروزي أبو عبدالله في الفتن (لولا أن أشهد الملحمة العظمى فإن الله تعالى يحرم على كل حديدة

أن تجبن، فلو ضرب الرجل يومئذٍ بسفود لقطع) السفود الحديدة الصغيرة المدببة، ألا يدل على الرصاصة!!

واتە مەبەست پێی لە گولەیە. سەیربکەن چۆن بەوردی شتەکان باسکراون خاڵ بە خاڵ، سبحان الله ئەمانە قسەیەکی هەڵبەستراو نییە هەرچەندە زاناکان بەلاوازیان داناوە. بەڵام ئێوە بیهێننە پێش چاوتان بەر لە پێنج سەد یان سێ سەد ساڵ ئەم قەولەتان بهاتبایە پێش چاوان چی هەڵوێستێکتان بۆی دەبوو!

ئێمە بیرمان دەکردەوە کاکە باڵندە چۆن شتی وادەکات شتی وا مەحاڵە و نابێت چۆن ئاگر لەنێوان باڵەکانی دەردەچێت. بۆیە تەنانەت دەیان ووت کاکە ئەمە تەنیا خەیاڵە و شتی وا بوونی نییە!! ئەمە ئەو کات وامان دەوت، بۆچی؟ چونکە عەقڵی مرۆڤ سنوری دیاریکراوە، تێگەیشتنی نەک بێسنووربێت.

بزانین ئێستا چی دەڵێین. بیرێک لە واقیع و لەو شتانەی لەبەرچاوە دەکەینەوە ڕاستەوخۆ دەڵێین فڕۆکە لەوێنەی باڵندە و فڕۆکەی جەنگی لەنێوان باڵەکانی ساروخ دەردەچێت. لەکاتی بەرکەوتنی بە زەوی، زەوی

شەقە دەكات ئەمە ڕاستە، گویّ بەهۆی دەنگەكەی كەڕ دەكات ئەمەش هەر ڕاستە، تەپوتۆز و دووكەڵیش دروستە دەكات ئەمەشیان هەر ڕاستە. واتە ئەو وردەكارییەی فەرموودەكە داوێتی هەمووی ڕاستە و لەگەڵ واقیع ئەمڕۆش یەكدەكاتەوە.

ئێستا ئێوە پێم بڵێن لە كام سەردەم زیاتر حەق و ڕاستییەكانمان بۆ دەردەكەوت كامیان پێكانی زیاتر بوو بێگومان ئێستا. بۆیە چاك بزانن عەقڵی مرۆڤ مەحدودە و تەقەبولی هەموو شتێک ناكات. بۆیە هەموو ئەم وردەكاریانەیان پیّ هەزم نەكراوە.

بەڵگەیەک بۆ ئەم قسەیە قەولی هاوەڵی بەڕێز "حذيفة بن اليمان" رضى الله عنه، دەهێنمەوە. دەڵێت: عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ، فَمَا مِنْهُ شَيْءٌ إِلَّا قَدْ سَأَلْتُهُ، إِلَّا أَنِّي لَمْ أَسْأَلْهُ: مَا يُخْرِجُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ.[١]

١ رواه مسلم في كتاب فتن واشراط الساعة: برقم ١٩١٠

"حذیفة" خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خەبەری پێداوم لەوەی کە ڕوودەدات تا ڕۆژی قیامەت. هیچ شتێک نەماوەتەوە لێی ئیلا پرسیارم لێکردووە دەربارەی. مەگەر ئەوە کە لێم نەپرسی چی خەڵکی مەدینە لە مەدینە دەردەکات. کەواتە دەتوانین بڵێین زانستی کۆدەکانە.

### ٣- زانستێکە مەترسیدارە:

لەبەرئەوەی لەم عیلمەدا کە ئیسڕاری زۆری زوڵم و ستەمکارانی تێدایە، بۆیە ئەم کەسانەی باسی ئەم عیلمە دەکەن مەترسیان لەسەرە، بۆ؟ چونکە عەرشی طاغوتان سڕیان کەشف دەکات. نموونە تەنانەت هاوەڵی بەڕێز و گەورە صەحابی ترساوە. "أبو هريره" رضى الله عنه ترساوە لە وتنی هەموو شتێک، وەک لەم فەرموودەی کەوا لە بەشی یەکەم هێنام بەوەی وتی گەر باسی بەشێکیان بکەم ئەوا ملم دەبڕن.

**تێبینی:** دڵنیابن ئەوانە هەرگیز کەتمی حەقیان نەکردووە و دڵنیاش بن کەوا باسیان کردووە، بەڵام لە هەموو شوێن و کەسێک نا وەک ئەم فەرموودەیەی: وعَنْ يَزِيدَ بْنِ الْأَصَمِّ، قَالَ: قِيلَ لِأَبِي هُرَيْرَةَ: أَكْثَرْتَ أَكْثَرْتَ، قَالَ: فَلَوْ حَدَّثْتُكُمْ بِكُلِّ مَا سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ لَرَمَيْتُمُونِي

بِالْقَشْعِ، وَلَمَا نَاظَرْتُمُونِي. القشع: ما يقلع عن وجه الأرض من المدر والحجر.[1]

سەیر بکەن دەڵێت گەربێت و هەڵسم بە ووتنی ئەوانەی کەوا لە پێغەمبەر ﷺ گوێم لێبووە و بیستوومە، ئەوا لە ناوم دەبەن.

بێگومان ئەم کات باس لە زەمەنی فیتنەی "غلمان یزید" دەکات، کەوا رسول الله ﷺ دەفەرموویێت: (هلاك أمتى على يد غلمان من قريش).

بۆیە نەیوێراوە باسی بکات، بەڵام دواتر هەر باسیکردووە. بۆیە ئێمەش دەبینین لە فەرمووده نازناوی (سفیانی) بە واتای زاڵم و ستەمکار هاتووە دەدرێتە پاڵ "بەشار" و "سیسی" الخ.. واتە لە (فتن وملاحم) ورد و درشت باسکراوە. تەنانەت ساڵ بە تەحدید و دیاریکراوی هاتووە. زۆر کەس دەڵێن نابێت بە هیچ شێوەک ناوی ساڵ بێت یان هیچ بەڵگەیەک نییە بڵێت فلان ساڵ.

---

١ رواه أحمد في "المسند " (١٦/٥٦٣) وقال المحققون: إسناده صحيح.

**وەڵام:** هاوەڵی بەڕێز ئەبوهرێرە ڕەزاو ڕەحمەتی الله‌ی لێبێت. زۆر بە وردی و بەتەحدیدی ناوی ساڵ دەهێنێت، نموونە: قال: وقد كان أبو هريرة يكني عن بعضه، ولا يصرح به ؛ خوفا على نفسه منهم، كقوله: أعوذ بالله من رأس الستين، وإمارة الصبيان.[١]

واتە "حافظ ابن حجر العسقلانی" لە (فتح الباری)دا دەڵێت ئەبوهورێرە هەندێکی درکاندووە و هەندێکی نەدرکاندووە لە ترسی نەفسی خۆی!

پەنا گرتنی ئەبو هورێرە لە ساڵی شەستەکان و دەسەڵاتی منداڵ. بزانە چۆن ناوی ساڵ دەهێنێت باشە کوێ زانی ئەگەر ئاگادار نەکرابێت و ئێمەش بەهۆی ئەوەی ئێستا.

١. فەرموودەی بورهە.

٢. عائذی یەکمان هەیە.

١ وقد استشهد به الحافظ ابن حجر في "فتح الباري" (٢١٦/١)

گریمانەمان داناوە بەپێی فەرمووده و واقع نەک قسەی گیرفانمان بێت. کەواتە با لێتان نەبێتە شتێکی زۆر خەتەر و یان بڵێین بوونی نییە. نەخێر لەم عیلمە زۆر شت هەیە کەوا زۆر کەم خەڵک دەیزانێت و هەستی پێ دەکات.

لەکۆتاییدا تا نەگەڕێنەوە بۆ نێو ئەم زانستە زۆر بەزەحمەت لە ڕووداوەکانی ئەمڕۆ تێدەگەن و ناتوانن قبوڵیشی بکەن، بۆیە ئەگەر تێ نەگەیت و قبوڵی نەکەیت ئەم کات ئینکاری و دژایەتیشی دەکەیت. کەواتە دەبیتە (خَسر خُسرانًا مبینا).

**خزمەتکاری ئیسلام**

**لێکۆڵەر، ئەبی عبدالله کوردستانی**

